# دەق و واتای
# الأَرْبَعِينَ النَّوَوِيِة
# بەكوردی

أبو زكريا يحيى بن شرف الحزامي النووي

به كوردیكردنی:
محمد ماحی

دەق و واتای الأَرْبَعِينَ النَّوَوِيَة بەكوردی

ئیمامی نەوەوی

# دەق و واتای
# الأَرْبَعِينَ النَّوَوِيِة
# بەکوردی

داناني:

أبو زكريا يحيى بن شرف الحزامي النووي

به كورديكردنى:

مُحَمَّد ماحى

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِنَّ الحمد للهِ نَحمدهُ وَنَسْتَعِينُهُ ونَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللّٰهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنا وَمِنْ سَيِّئاتِ أَعْمَالِنا، مَنْ يَهْدِهِ اللّٰهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلِ فَلا هادِيَ لَهُ. أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللّٰه وَأَشهَدُ أَنَّ محمد اً عَبدُهُ وَرَسُولُهُ.

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ

يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا * يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا

أَمَّا بَعْدُ: فَإِنَّ أَصْدَقَ الحَدِيثِ كِتابُ اللهِ، وَخَيرَ الهَدِي هَدْيُ محمد صَلَى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ

وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ، وَكُلَّ ضَلَالَةٍ فِي النَّارِ.

# ناوەڕۆك

## پێشەکی ئیمامی نەوەوی

## بسم الله الرحمن الرحيم

سەناو ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانیان، ڕاگری زەمین و ئاسمانەکان، هەڵسوڕێنەری ژین و کاری تەواوی بوونەوەران، نێرەری پێغەمبەران، درودو سەلامی خۆی برژێتە سەریان، ناردوونیە لای مرۆڤە پێگەیشتووەکان، بۆ ڕێنمایی شەریعەت و ڕێکخستنی ژیان، بە بەڵگەی یەکلاکەرەوەو نیشانە بەهێزەکان، تا بە ڕاستەڕێ سەرفرازبن و و بچنە ڕیزی بەختەوەران.

سوپاس بۆ خوا لەسەر هەموو بەخشینەکان، داواخوازی زیاترم لێی لەمیهری پڕ فەڕ و بێ پایان، شاهێدی دەدەم بە دڵم و جەستە و زوبان، پەروەردگارو پەرستراوو حاکمی ڕەها نییە بۆ ژیان، نە لە زەمین و نە لە ئاسمان، جگە لە خوای تاك و پاك و میهرەبان، کردگاری دادگەری حوکمڕان، دانای لێبوردەی کارجوان.

شاهێدیش دەدەم کە موحەممەد (ﷺ) نێردراوی بیرمەندو، بەندەی جوامێری مەردو، خۆشەویستی دڵپەیوەندو بەرزترینە لە دروستکراوەکان، ڕێزلێگراوە بەکەلامی پیرۆزی قورئان، موعجیزەی بەردەوامی گشت سات و سەردەمان، بە سوننەتی نووری ڕێی ئامۆژگاران، تایبەتمەندە بە (جوامع الکلم) زۆری ماناو پوختەی قسان، خاوەنی دواهەمین ئایین و کتێبە ئاسمانییەکان، صەلات و سەلامی خوا بە لێزمەو بەگوڕتر لە باران، بڕژێتەسەر خۆی و تەواوی پێغەمبەران هەم بۆ خانەوادە و هاوەڵ و هەر هەموو چاکەکاران.

لە عەلی کوڕی ئەبوتالیب، و عبدالله کوڕی مەسعود، و موعازی کوڕی جەبەل ، و ئەبو دەرداء ، و ئیبنو عومەر، و ئیبنو عەبباس، و ئەنەسی کوڕی مالیك، و ئەبو هورەیرە، و ئەبو سەعیدی خودری، خوا لێیان رازی بێت بە کۆمەڵێك ڕیوایاتی زۆرو جۆراوجۆر پێمان گەیشتووە کە پێغەمبەری خوای خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (مَنْ حَفِظَ على أمَّتي أربعين حديثًا من

أمْر دينِها بعثَه الله في زُمْرةِ الفُقهاءِ والعلماء) واتا: هەر کەسێ چل فەرموودە لە باسەکانی دینداریی بگەیەنێت بە ئوممەتەکەم خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا لە ڕیزی زانایان و شەرعناساندا زیندوویدەکاتەوە. لە ڕێوایەتێکی تردا: (...بعثه الله فقيهًا عالمًا)) واتا: خوای گەوە وەکو زانایەکی شەرعناس زیندوویدەکاتەوە. لە ریوایەتی ئەبودەردائیشدا خوا لێی رازی بێت هاتووە (...وكنت له يوم القيامة شافعًا وشهيدًا) واتا: منیش (پێغەمبەری خوا ﷺ) لە رۆژی قیامەتدا دەبمە تکاکارو شاهێدیی. لە ڕیوایەتی ئیبنومەسعودیش خوا لێی رازی بێت هاتووە کە فەرموویەتی: (...قيل له: ادخل من أي أبوب الجنة شئت) واتا: (پێی دەگوترێ: بڕۆ بە هەشتەوە لە هەردەگایەکی کە خۆت پێت خۆشە) لە ڕیوایەتی ئینوعومەریش خوا لێی ڕازی بێت هاتووە: (كتب في زمرة العلماء، وحشر في زمرة الشهداء) واتا (لە ڕێزی زانایان دادەنرێت، و لە ڕێزی شەهیدان حەشردەکرێت).

بەڵام هەموو زانایانی فەرموودەناسی ڕاکۆن لەسەر لاوازی ئەم فە

رمووویە هەرچەندە ڕێگاکانیشی زۆرن[١] .

---

١ راستە. ئەم فەرموودەیە هەرچەندە زنجیرەی سەنەدی ریوایەتەکانی زۆر زۆرن، بەڵام هەر زەعیفەو زۆریی ریوایەتەکانیشی بەهێزی ناکەنەوە. ئیمامی ئیبنوحەجەر لە کتێبی (التلخيص الحبير ٩٣/٣)دا دەفەرموێ: حەسەنی کوڕی سوفیان لە (مەسنەد)ەکەی خۆیدا لە ئیبنوعەبباسەوە هێناویتییەوە، پاشان لە سێزدە یاوەریترەوە. ئیبنولجەوزیش لە (العلل المتناهية)دا هەموو سەنەدەکانی هێناوەتەوەو توێژینەوەی بۆ هەموویان کردووەو گەیشتۆتە ئەوەی کە (زەعیفەو بەهێزناکرێت). پاشان ئیمامی ئیبنوحەجەر هەر لەوێدا دەفەرموێ: ( پوختەی حوکمەکەم لە کۆڕی شازدەیەمم لە (الاملاء)دا روونکردووەوەو ووتم کە هیچ یەکێک لە ریوایەتەکانی لە خەلەل بەدەرنین).. زۆر لە زانایان کە باس لە زەعیفی ریوایەتێک دەکەن، ریوایەتێکی سەحیح وەکو بەدیلی دەهێننەوە. بۆیە دەشێت لە جیاتی ئەو ریوایەتانە ئەم فەرموودە سەحیحە _کە بیست یاوەر گێڕاویانەتەوە_ ببێتە هاندەرمان بۆ خوێندن و وەرگرتن و گەیاندنەوەی فەرموودە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (نضَّرَ الله عبدًا سَمِع مقالتي فوعاها، فبَلَّغها مَن لَم يَسْمعها، فرُبَّ حامل فِقْه إلى مَن هو أفقه منه، ورُبَّ حامل فِقْه لا فِقْهَ له.) ئیبنوداوود (٣٦٦٠)، ترمذی (٢٦٥٦)، ئیبنوماجه (٢٣٠)، ئەحمەد (٤١٥٧). واتە: خوای گەورە روخساری ئەو کەسە گەشکات و نیعمەتی زیاتری پێببەخشێت کە قسەکەی منی گوێ لێدەبێت و بەو شێوەیەی گوێی لێبووە دەیگەیێنێتەوە، لەوانەیە ئەو کەسەی زانستییەک بڵاودەکاتەوە بە کەسانێکی بگەیێنێت کە لە خۆی زیرەکترین و

لـەم بابـەتـەشـدا زانایـان ڕەحمەتـی خوایـان لێ بێـت ئـەوەنـدە نوسراویان هەیە، کە لە ژمارە نایەن. یەکەم کەس کە زانیبێتم لەم بابەتەوە نووسیبێتی عبداللە ی کوڕی موبارەك بووە، پاشان محمدی کوڕی ئەسلەمی توسی، کە زانایەکی خوایی بوو، ئینجا حەسەنی کوڕی سوفیانی نەسەوی، و ئەبوبەکری ئەجەری، هەروەها ئەبوبە کر محمدی کوڕی ئیبراهیمی ئەصفەهانی، و دارەقـوطنی، و حاکم، و ئەبونوعەیمی ئەصفەهانی و، ئەبوعبدالرحمنی سولەمی، و ئەبو سەعید مالینی، و ئەبو عوسمانی صابونی، و محمدی کوڕی عبداللە ی ئەنصاری، و ئەبوبەکری بەیهەقی.. و خەڵکانێکی تر کە لە ژمارە نایەن، چ لەوانەی پێشین و چ لەوانەی پاشین. منیش ئەو زاناو پارێزەرو پاسەوانانەی ئیسیلامم کردە سەرمەشق و ئیستخارەم بەخوای گەورە ی گەورە کرد لە کۆکردنەوەی ئەو چل فەرموودەیە دا، زانایانیش هاوڕان لەسەر ئەوەی کار بە فەرموودەی لاواز

---

باشتر لێی تێبگەن. دەشێت کەسێک زانستییەک نەقڵدەکات بەڵام خۆی زانا نەبێت..

بکرت، لە بواری هاندان بۆ ئەنجامدانی کردەوەی چاك. لەگەڵ ئەوەشدا پشتم بەو فەرموودە لاوازانە نەبەستووە، بەڵکو لەسەر فەرموودەی راست و دروستی پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرموویە تی: (لِيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ مِنْكُمُ الْغَائِبَ)[1] واتا: ئەوانەی ئامادەن (و زاناو شارەزان) بیگەیەنن بەوانەتان کە ئامادەنین(پێیان نەگەیشتووە). هەروەها فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ: (نَضَّرَ اللَّهُ امْرَأً سَمِعَ مَقَالَتِي فَوَعَاهَا، فَأَدَّاهَا كَمَا سَمِعَهَا[2]) واتا: خوای گەورە روخساری ئەو کەسە بگەشێنێتەوە کە کە گوێی لە قسەیەکی من دەبێت ولێی تێدەگات، وچاك لە بەری دەکات و ، بەو شێوەیەی کە بیستوویە تی دەیگەیەنێتەوە.

لەمەوەیە کە هەندێ لە زانایان هاتوون و چل فەرموودەیان لە بچینەکانی دین و هەندێکیان لە لقەکانی دین و هەندێکیان لە

١ بوخاری (١٠٤)، موسلیم (١٣٥٤).

٢ نووسەری بەرێز رحمەالله نوسیوێتی (أخرجه البزار ( ٨ / ٣٤٢ رقم : ٣٤١٦)، راستە: ترمذی (٢٦٥٨)، ئەحمەد (٢١٦٣٠) شێخی ئەلبانی رحمەالله لە (صحيح ابن ماجه/٢٣٠)دا دەفەرموێ: سەحیحە.

باسی جیهاد، کۆکردۆتەوە، هەشیانە لەباسی زوهدو دونیانە ویستی، یان لە ئاداب، یان لە وتارو ئاماۆژگاریی.. هەمووشیان بە مەبەستی چاکسازی کردوویانە خوا لێیان رازی بێت. منیش پێم باش بوو  کە چل فەرموودە کۆبکەمەوە کە لە هەموو ئەو باباتانە گرنگتربێت، چل فەرموودەی گشتیر کە هەموو ئەو بابەتانەی لە خۆگرتووە. هەر فەرموودەیەکیش رێسایەکی گەورەو گرنگی لە رێسا شەرعییەکان تێدایە، لەوانەی زانایانی ئیسلامی جەختیان لە سەر کردۆتەوە کە تەلاری ئیسلامیان لەسەرە. لەوانەی فەرموویانە: ئەم فەرموودە نیو یان سێیەکی ئیسلامە! یان شتی تری لەو جۆرەیان فەرمووە. پابەندیش بووم لەوەی هەموو فە رموودەکانی (ئەربەعین)ەکە صەحیح بن، زۆریشنەشیان لە فە رموودە صەحیحەکانی بوخاری و موسلیمن، بە نادیاری سەنەدە کانیش هێناومەتەوە، تا ئاسان لەبەر بکرێن و هەموو خەڵکیش سوودی لێ وەربگرن ان شاءاللە.

پێویستە لەسەر ئەو کەسەی کە قیامەتخوازە، شارەزای ئەو فە رموودانە ببێت، لەبەر ئەوەی باسە گرنگەکانی لە خۆگرتووە، کە پێداگریی و ئاگاداریی و ئامۆژگاریی لەسەر تەواوی بەندایەتییەکان دەدەن. ئەمەش ئاشکرایە بۆ هەرکەسێك کە سەرنجیان لێ بدات.

پشتم تەنها بە خوای گەورە بەستووە، هەموو داواو کارو فرمانێکم بۆ ئەو بەرزدەکەمەوەو، سوپاسیکاریی هەر بۆ ئەوەو بە خشینەکانیش هەرهی خۆین، سەرکەوتن و پارێزراویش هەر بەدە سەڵاتی ئەوە.

## فەرموودەی یەکەم

### خواویستی

عَنْ أَمِيرِ الْمُؤْمِنِينَ أَبِي حَفْصٍ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: سَمِعْت رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: إنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ، وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى، فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ فَهِجْرَتُهُ إلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ، وَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ لِدُنْيَا يُصِيبُهَا أَوْ امْرَأَةٍ يَنْكِحُهَا فَهِجْرَتُهُ إلَى مَا هَاجَرَ إلَيْهِ. متفق عليه.

پێشەوای باوەڕداران باوکی حەفسە عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێت فەرمووی: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست کە دەیفەرمو: پاداشتی هەموو کردارێك بە مەبەستەکەیەتی، هەموو کەسێکیش هەر ئەوەی پێ دەبەخشرێت کە نیازی بووە، هەر موسڵمانێك لە پێناوی خوای

گەورەدا کۆچبکات بۆ لای پێغەمبەرەکەی خوا ﷺ ئەوا هیجرەتەکەی لە پێناو خواو پێغەمبەری خوادا بۆ هەژماردەکرێت، هەرکەسێکیش بۆ دەستخستنی بەرژەوەندی دونیایی، یان بۆ هاوسەرگیری ئافرەتێك ناوچەی خۆی جێبهێڵێت ئەوا کۆچکردنەکەی هەروا بۆ هەژماردەکرێت کە بۆی هاتووە.[1]

---

[1] ئەم فەرموودەیە هەردوو پێشەوای بەرزو بەڕێزی فەرموودە ریویەتییان کردووە و بە صەحیحییان ناساندووە: یەکەمیان: باوکی عەبدوڵڵا موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی ئەبولموغیرەی کوڕی بەردیزبەی ئەلجەعفی کە ناسراوە بە (ئیمام بوخاری. ١٩٤-٢٥٦ك رەحمەتی خوای لێبێت) بەژمارە [١]. وەهەروەها باوکی حوسەین موسلیم ی کوڕی حەججاجی کوڕی موسلیمی کوڕی کەرشانی قوشەیری نەیسابووری کە ناسراوە بە (ئیمامی موسلیم ٢٠٤-٢٥٩ك رەحمەتی خوای لێ بێت) بەژمارە [١٩٠٧]

## فەرموودەی دووەم

### دەربارەی ئیسلام و باوەڕ و چاکەکاری

عَنْ عُمَرَ رضي الله عنه أَيْضًا قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ جُلُوسٌ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ، إِذْ طَلَعَ عَلَيْنَا رَجُلٌ شَدِيدُ بَيَاضِ الثِّيَابِ، شَدِيدُ سَوَادِ الشَّعْرِ، لَا يُرَى عَلَيْهِ أَثَرُ السَّفَرِ، وَلَا يَعْرِفُهُ مِنَّا أَحَدٌ. حَتَّى جَلَسَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ. فَأَسْنَدَ رُكْبَتَيْهِ إِلَى رُكْبَتَيْهِ، وَوَضَعَ كَفَّيْهِ عَلَى فَخْذَيْهِ، وَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ أَخْبِرْنِي عَنْ الْإِسْلَامِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْإِسْلَامُ أَنْ تَشْهَدَ أَنْ لَا إلَهَ إلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، وَتُقِيمَ الصَّلَاةَ، وَتُؤْتِيَ الزَّكَاةَ، وَتَصُومَ رَمَضَانَ، وَتَحُجَّ الْبَيْتَ إنْ اسْتَطَعْت إلَيْهِ سَبِيلًا. قَالَ: صَدَقْت . فَعَجِبْنَا لَهُ يَسْأَلُهُ وَيُصَدِّقُهُ! قَالَ: فَأَخْبِرْنِي عَنْ الْإِيمَانِ. قَالَ: أَنْ تُؤْمِنَ بِاَللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ. قَالَ: صَدَقْت. قَالَ: فَأَخْبِرْنِي عَنْ الْإِحْسَانِ. قَالَ: أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ

كَأَنَّك تَرَاهُ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاك. قَالَ: فَأَخْبِرْنِي عَنْ السَّاعَةِ. قَالَ: مَا الْمَسْئُولُ عَنْهَا بِأَعْلَمَ مِنْ السَّائِلِ. قَالَ: فَأَخْبِرْنِي عَنْ أَمَارَاتِهَا؟ قَالَ: أَنْ تَلِدَ الْأَمَةُ رَبَّتَهَا، وَأَنْ تَرَى الْحُفَاةَ الْعُرَاةَ الْعَالَةَ رِعَاءَ الشَّاءِ يَتَطَاوَلُونَ فِي الْبُنْيَانِ. ثُمَّ انْطَلَقَ، فَلَبِثْتُ مَلِيًّا، ثُمَّ قَالَ: يَا عُمَرُ أَتَدْرِي مَنْ السَّائِلُ؟. قُلْتُ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: فَإِنَّهُ جِبْرِيلُ أَتَاكُمْ يُعَلِّمُكُمْ دِينَكُمْ[1] .

له پێشەوای باوەڕدارانەوە، سەیدنا عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێت فەرمووی: ڕۆژێکیان لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ دانیشتبووین، پیاوێك هاتەناومانەوە کە بەرگی بەرێی زۆر سپی بوو و مووی زۆر ڕەش بوو، ئاسەواری سەفەری لێ بەدینەدەکرا (تۆزو خۆڵاویی نەبوو و ماندوویێتی پێوە دیارنەبوو)و هیچ کامێکیشمان نەماندەناسی. چووەخزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و لەبەرانبەری بەشێوەیەك دانیشت کە ئەژنۆی نوساند بە ئەژنۆی پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه

١موسلیم (٨)، ئەبوداوود (٤٦٩٥)، ترمذی (٢٦١٠)، نەسائی (٤٩٩٠)، ئیبنوماجە (٦٣).

وسلم و لەپی دەستەکانی خستە سەر هەردوو ڕانی و پرسی: ئەی موحەممەد باسی ئیسلامم بۆ بکە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئیسلام ئەوەیە کە شایەتمان بهێنیت و بڕیار بدەیت کە هیچ شتێك نییە شایانی پەرستن بێت جگە لە خوای گەورە. بڕیار بدەیت کە مُحَمَّد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بەندەو نێردراوی خوایەو نوێژبکەیت و زەکاتبدەیت و ڕۆژوی ڕەمەزان بگریت، ئەگەر توانات هەبوو حەجی ماڵی خوا بکەیت. کابرا فەرمووی: ڕاستتکرد. بەلامانەوە سەیربوو، کە پرسیاری لێدەکات دەشڵێت ڕاستتکرد!. پاشان فەرمووی: ئەدی باوەڕهێنان چۆنە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ لە وەڵامیدا فەرمووی: ئەوەیە کە: باوەڕ بە خواو بە فریشتەکانی و بە کتێبەکانی و بە نێردراوەکانی و بە ڕۆژی دوایی و هەروەها بە خێروشەڕی قەدەر بهێنێت. کابرا دیسانەوە فەرمووی: ڕاستتکرد!. دواتر فەرمووی: ئەدی چاکە چییە؟ فەرمووی چاکە ئەوەیە، کە وا خوا بپەرستیت، کە هەر وەکو ئەوەی ببینیت، خۆ ئەگەر تۆش ئەو نەبینیت، ئەو تۆ دەبینێت. ئینجا فەرمووی: کەی ڕۆژی دواییە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لەم باسەدا پرسیارلێکراو لە پرسیارکار زاناتر نییە. پیاوەکە پرسی باشە

نیشانەکانی چیین؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوەیە کە کۆیلەکان گەورەی خۆیانیان لێدەبێت، پێپەتیی و ڕەشوڕوت و شوانی مەڕ کۆشك و تەلاریان زۆر بەرزدەکەنەوەو شانازییان پێوەدەکەن! ئیتر کابرا ڕۆیشت.

دوای سێ رۆژ پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: عومەر، دەزانی ئەوە کێ بوو دەیپرسی؟ ووتم: خواو پێغەمبەری خوا دەزانن. فەرمووی: ئەوە جوبرەئیل بوو، هاتبوو، دینەکەتان فێربکات.

## فەرموودەی سێیەم

### کۆشکی ئیسلام لەسەر پێنج کۆڵەگەیە

عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: سَمِعْت رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: بُنِيَ الْإِسْلَامُ عَلَى خَمْسٍ: شَهَادَةِ أَنْ لَا إلَهَ إلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، وَإِقَامِ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَحَجِّ الْبَيْتِ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ. متفق عليه[1]

باوکی عبدالرحمن عبداللەی کوڕی عومەری کوڕی خەتتاب خوا لییان ڕازی بێت. فەرمووی: لە پێغەمبەری خوام بیست ﷺ کە دەیفەرموو: ئیسلام لەسەر پێنج کۆڵەگە دامەزراوە: شایەتمان، واتە: شاهێدیدان کە هیچ پەرستراوێك نییە شایانی پەرستن بێت، جگە لە خوای گەورەو، بڕیاردان کە مُحَمَّد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نێرراوی خوایە، هەروەها پیادەکردنی نوێژو زەکاتدان،و حەجکردنی ماڵی خواو گرتنی ڕۆژوی ڕەمەزان.

---

١ بوخاری (٨)، موسلیم (١٦).

# فەرموودەی چوارەم

## لە تنۆکێك ئاوەوە بەرەو ڕێزلێنانی خوای پەروەردگار

عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﵁ قَالَ: حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ -وَهُوَ الصَّادِقُ الْمَصْدُوقُ-: إنَّ أَحَدَكُمْ يُجْمَعُ خَلْقُهُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا نُطْفَةً، ثُمَّ يَكُونُ عَلَقَةً مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يَكُونُ مُضْغَةً مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يُرْسَلُ إلَيْهِ الْمَلَكُ فَيَنْفُخُ فِيهِ الرُّوحَ، وَيُؤْمَرُ بِأَرْبَعِ كَلِمَاتٍ: بِكَتْبِ رِزْقِهِ، وَأَجَلِهِ، وَعَمَلِهِ، وَشَقِيٍّ أَمْ سَعِيدٍ؛ فَوَاَللَّهِ الَّذِي لَا إلَهَ غَيْرُهُ إنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا إلَّا ذِرَاعٌ فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ فَيَدْخُلُهَا. وَإِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا إلَّا ذِرَاعٌ

فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَيَدْخُلُهَا. رواه الشيخان[1]

باوکی عبدالرحمن عبداللەی کوڕی مەسعود خوا لێی ڕازی بێت فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ ـکە ڕاستگۆترین و بەڕاستزانراوترین کەسەـ بۆی گێڕاینەوە کە: هەریەکێك لە ئێوە (قۆناغەکانی) خەلقبوونی لە سکی دایکیدا دەبڕێت. ماوەی چل ڕۆژی یەکەمین تەنها تنۆکێك ئاوی مەیبووە (بە هێلکەدانی ئافرەتەوە)، دواتر دەبێتە خوێنپارە (وەکو زەروو)ی هەڵواسراو بەرەحمی دایکەوە، پاشان دەبێتە پارچەیەک گۆشت و خوێن (وەکو پارووبەکی جووراو)، ئینجا خوای گەورە فریشتەیەکی بۆ دەنێرێت کە ڕۆحی بەبەردادەکات و فەرمانی بە چوار ووشە پێدەکات (کە لە چارەی بنوسرێت): ڕزق و ڕۆزیی، تەمەن و ئاکامی مردنی (ئەجەلی)، کارو کردەوەکانی، بەدبەختە یان بەختەوەر. جا سوێند بەو خوایەی کە هیچ پەستراوێکی بەحەق جگە لەو نییە، کەسی واتان تێدایە کاروکردەوە بە

---

1 بوخاری (٣٢٠٨)، موسلیم (٢٦٤٣).

ڕەفتاری ئەهلی بەهەشت ئەنجامدەدات و تا ئەوەندەی گەزێکی دەمێنێت بۆ چوونە ناو بەهەشت، بەڵام نوسراوەکەی پێشیدەکەوێت و کاروکردەوەی ئەهلی دۆزەخ دەکات و دەچێتە دۆزەخەوە! کەسانی واشتان هەیە کاروکردەوە بە ڕەفتاری ئەهلی ئاگر ئەنجامدەدات، تا ئەوەندەی گەزێکی دەمێنێت بۆ چوونە دۆزەخەوە، بەڵام نوسراوەکەی پێشیدەکەوێت و کاروکردەوەی ئەهلی بەهەشت دەکات و دەچێتەبەهەشتەوە!

## فەرموودەی پێنجەم

دژواریی داهێنراو لە دیندا

عَنْ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ أُمِّ عَبْدِ اللَّهِ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ مِنْهُ فَهُوَ رَدٌّ.[1]

وَفِي رِوَايَةٍ لِمُسْلِمٍ:مَنْ عَمِلَ عَمَلًا لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ .

دایکی باوەڕداران عائیشە خوا لێی ڕازی بێت فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەسێ لە کاروباری (دینداری) ئێمەدا شتێك دابهێنێت کە لە دینەکەوە نەهاتبێت، ئەوە ڕەتدەکرێتەوە. (مەرفووزە).

لەڕیوایەتی ئیمامی موسلیمدا هاتووە کە: هەرکەسێ شتێک داهێنێت کە ئەم دینەی ئێمە نەیگرێتەوە ئەوە ڕەتدەکرێتەوە..

---

١. بوخاری (٢٦٩٧)، موسلیم (١٧١٨).

## فەرموودەی شەشەم

سنووری نێوان حەرام و حەڵاڵ ئاشکرایە

عَنْ أَبِي عَبْدِ اللَّهِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: سَمِعْت رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: إنَّ الْحَلَالَ بَيِّنٌ، وَإِنَّ الْحَرَامَ بَيِّنٌ، وَبَيْنَهُمَا أُمُورٌ مُشْتَبِهَاتٌ لَا يَعْلَمُهُنَّ كَثِيرٌ مِنْ النَّاسِ، فَمَنْ اتَّقَى الشُّبُهَاتِ فَقْد اسْتَبْرَأَ لِدِينِهِ وَعِرْضِهِ، وَمَنْ وَقَعَ فِي الشُّبُهَاتِ وَقَعَ فِي الْحَرَامِ، كَالرَّاعِي يَرْعَى حَوْلَ الْحِمَى يُوشِكُ أَنْ يَرْتَعَ فِيهِ، أَلَا وَإِنَّ لِكُلِّ مَلِكٍ حِمًى، أَلَّا وَإِنَّ حِمَى اللَّهِ مَحَارِمُهُ، أَلَّا وَإِنَّ فِي الْجَسَدِ مُضْغَةً إذَا صَلَحَتْ صَلَحَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، وَإِذَا فَسَدَتْ فَسَدَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، أَلَا وَهِيَ الْقَلْبُ.[١]

لە باوکی عبداللهوە، کە نوعمانی کوڕی بەشیرە، خوای گەورە لە خۆی و باوکی ڕازی بێت فەرمووی: گوێملێبوو کە پێغەمبەری خوا صلی الله

---

١ بوخاری (٥٢)، موسلیم (١٥٩٩).

علیه وسلم دەیفەرموو: بە دڵنیاییەوە حەڵاڵ ئاشکرایەو حەرامیش ئاشکرایەو لەو نێوەندەشدا هەندێ شتی جێی گومان هەن، کە زۆربەی خەڵکی نایانزانن، هەر کەسێ پارێز لە شتە گومانلێکراوەکان بکات، ئەوا پاکانەی بۆ دین و ئابڕووی خۆی کردووە، هەر کەسێکیش بکەوێتە ناو بابەتە گوماناوییەکان، ئەوا کەوتۆتە نێو حەرامەوە. ئەمە وەکو شوانێکە کە ئاژەڵەکانی لە دەوری پاوانێکی پەرژیندار‌دا بلەوەڕێنیت، خەریك بێت ئاژەڵەکانی سنووری پەرژینی پاوانەکە ببەزێنن. بزانن هەموو دەسەڵاتدارێک سنوور و پەرژینی تایبەت بە موڵکی خۆی هەیە، (کە کەس نابێت ئەو سنوورانە ببەزێنێت)، بزانن کە سنوور و پەرژینی خوای گەورەش قەدەغەکراوەکانییەتی. ئەوەش بزانن کە لە جەستەدا پارچە گۆشتێك هەیە، ئەگەر ئەو چاك و پاك بێت هەموو لاشە چاکدەبێت، ئەگەر ئەو پیس و خراپبێت هەموو جەستە پیس و خراپدەبێت. ئەو پارچە گۆشتە دڵە.

## فەرموودەی حەفتەم

### ئایین ئامۆژگاریی و خواویستییە

عَنْ أَبِي رُقَيَّةَ تَمِيمِ بْنِ أَوْسٍ الدَّارِيِّ رضي الله عنه أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: الدِّينُ النَّصِيحَةُ. قُلْنَا: لِمَنْ؟ قَالَ لِلَّهِ، وَلِكِتَابِهِ، وَلِرَسُولِهِ، وَلأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ.[1]

لە باوکی روقەییەوە، کە تەمیمی کوڕی ئەوسی داریە خوا لێی رازی بێت هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دین بریتییە لە ئامۆژگاریی . وتمان: (ئامۆژگاری) کێ بۆ کێ؟ فەرموو: ئامۆژگاریی خوای گەورە: بەندایەتی کردنە بۆی، ئامۆژگاریی بۆ کتێبەکەی: باوەڕ پێهێنان و جێبەجێکردن و چەسپاندنێتی، ئامۆژگاریی بۆ پێغەمبەری خوا: باوەڕپێهێنانێتی بە شیوەیەک کە جەنابی بکەیتە تاکە پێشەوا، ئامۆژگاریی بۆ زاناو سەرکردەی موسڵمانان: بەوەیە لە فەرمانە چاکەکانیان دەرنەچیت و

---

١. موسلیم (٥٥)، ئەبوداوود (٤٩٤٤)، نەسائی (٤١٩٧)، ئەحمەد (١٦٤٩٣).

یارمەتیدەریان بیت لەسەر چاکە. ئامۆژگاریی موسڵمانان: بەوەیە کە مافی
برایەتییان بدەیت.

# فەرموودەی هەشتەم

## تێکۆشان لە پێناو باوەڕ

عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أُمِرْت أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لَا إلَهَ إلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ، وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ؛ فَإِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ إلَّا بِحَقِّ الْإِسْلَامِ، وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللَّهِ تَعَالَى.[١]

لە ئینو عومەرە خوا لە خۆی و باوکی رازی بێت. گێڕدراوەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: فەرمانمپێدراوە کە جەنگ بەرانبەر خەڵکی بکەم تا شایەتیدەدەن کە هیچ خوایەک نییە شایانی پەرستن بێت جگە لە خوای گەورەو شایەتیدەدەن کە مُحَمَّد نێرراوی خوای گەورەیەو نوێژدەکەن و زەکاتدەدەن، و رۆژوودەگرن. ئەگەر ئەمانەیان کرد، ئیدی

١ بوخاری (٢٥)، موسلیم (٢٢).

خوێن و سامانیان پارێزراو دەبێت، مەگەر مافێکی شەرعییان بکەوێتەسەر، لێپرسینەوەشیان لای خوای بەرزو باڵادەستە.

## فەرموودەی نۆیەم

### گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ صَخْرٍ رضي الله عنه قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَا نَهَيْتُكُمْ عَنْهُ فَاجْتَنِبُوهُ، وَمَا أَمَرْتُكُمْ بِهِ فَأْتُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ، فَإِنَّمَا أَهْلَكَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ كَثْرَةُ مَسَائِلِهِمْ وَاخْتِلَافُهُمْ عَلَى أَنْبِيَائِهِمْ.[1]

لە ئەبو هویرەیرەوە کە (عبدالرحمنی کوڕی سەخر)ە، خوا لێی ڕازی بێت فەرمووی: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست کە دەیفەرموو: ئەوەی لێم قەدەغەکردن خۆتانی لێ بپارێزن و (دووربکەونەوە لێی)، ئەوەش کە فەرمانم پێ کردن تا لە تواناتاندا بێت بیکەن. چونکە تیاچوونی (میللەت و ئوممەتانی) پێش ئێوە لەبەر زۆری پرسیارەکانیان و ناکۆکیی و ڕاجیاییان بوو لەسەر (ڕاو ڕێی) پێغەمبەرەکانیان. سەلامی خوایان لێ بێت

---

١ بوخاری (٧٢٨٨)، موسلیم (١٣٣٧).

# فەرموودەی دەیەم

خوای گەورە پاکە و تەنها پاکی دەوێت.

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إنَّ اللَّهَ طَيِّبٌ لَا يَقْبَلُ إلَّا طَيِّبًا، وَإِنَّ اللَّهَ أَمَرَ الْمُؤْمِنِينَ بِمَا أَمَرَ بِهِ الْمُرْسَلِينَ فَقَالَ تَعَالَى: (يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنْ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحًا)[1] وَقَالَ تَعَالَى: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُلُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ) ثُمَّ ذَكَرَ الرَّجُلَ يُطِيلُ السَّفَرَ أَشْعَثَ أَغْبَرَ يَمُدُّ يَدَيْهِ إلَى السَّمَاءِ: يَا رَبِّ! يَا رَبِّ! وَمَطْعَمُهُ حَرَامٌ، وَمَشْرَبُهُ حَرَامٌ، وَمَلْبَسُهُ حَرَامٌ، وَغُذِّيَ بِالْحَرَامِ، فَأَنَّى يُسْتَجَابُ لَهُ؟.

ئەبوهورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: بەڕاستی خوای گەورە پاکهو پاکیشی قەبوڵە. خوای گەورە هەر ئەو فەرمانەی بە پێغەمبەرانی داوە، بە باوەڕدارانیشی

---

١ موسلیم (١٠١٥)، ترمذی (٢٩٨٩)م ئەحمەد (٣٢٨/٢)، داریمی (٢٧١٧).

داوه. خوای گەورە دەفەرموی: (يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنْ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحًا) المؤمنون/ ٥١ واتە: ئەی نێرراوانی خوا، حەڵاڵ بخۆن و کاروکردەوەی چاك بکەن لەبەرانبەریشیدا دەفەرموێ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُلُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ) البقرة/ ١٧٢ واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان بەخوداو پێغەمبەری خودا هەیە لەو حەڵاڵە بخۆن کە پێمان بەخشیون. پاشان (پێغەمبەری خوا ﷺ) باسی پیاوێکی کرد، کە رێبواری رێیەکی دوورەو، قژبژ و تۆزاییە. دەستەکانی بەرزدەکاتەوە بۆ ئاسمان و هاواردەکات: خوایە..! خوایە..! لە کاتێکدا خۆراکەکەی حەرامە، خواردنەوەکەی حەرامە، پۆشاکەکەی حەرامە، هەر بەرحەرامیش پێگەیشتووە، ئێ خوای گەورە چۆن ئاوا بە هانایەوە دێت و دوعاکانی قەبوڵ دەکات؟!

# فەرموودەی یازدەیەم

## لە گومانەوە بۆ دڵنیایی

عَنْ أَبِي مُحَمَّدٍ الْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ سِبْطِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَرَيْحَانَتِهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: حَفِظْت مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ دَعْ مَا يُرِيبُك إلَى مَا لَا يُرِيبُك[1].

باوکی مُحَمَّد، سەیدنا حەسەنی کوڕی ئیمامی عەلی، نەوەو ڕێحانەی پێغەمبەری خوا ﷺ، خوای گەورە لە خۆی و باوکی ڕازی بێت فەرمووی: ئەو (فەرموودەیەم) لە پێغەمبەری خواوە ﷺ وەرگرتووە، (کە فەرموویەتی): واز لەو شتانە بێنە کە گومانت لێیانە، ئەوانە بکە کە گومانت لێیان نییە.

---

[1] ترمذی (٢٥٢٠) دەشفەرموێ: (حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ)، نەسائی (٥٧١١)، ئەحمەد (١٦٣٠)،داریمی (٢٥٣٢)، ئیبنوحیببان (٧٢٢). شێخی ئەلبانی رحمەاللە لە: (إرواء الغليل/٢٠٧٤)دا دەفەرموێ: سەحیحە.

## فەرموودەی دووازدەیەم

خۆت لەشتی تایبەتی هەڵمەقورتێنە

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ حُسْنِ إِسْلَامِ الْمَرْءِ تَرْكُهُ مَا لَا يَعْنِيهِ[1].

ئەبوهورەیرە خوا لێی ڕازی بێت فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: نیشانەی چاکێتیی موسوڵمانێتیی ئەوەیە کە موسوڵمان خۆی لە شتێک هەڵنەقورتێنێت کە پەیوەندی بەوەوە نییە.

[1] ترمذی (٢٣١٨)، ئیبنوماجە (٣٩٧٩)، ئیبنوحیببان (٢٢٩/١)، بەیهیقی لە: شعب الإیمان ٢٥٥/٤). ئەم فەرموودە بەناوبانگ و بەربڵاوە، کە لە ڕێگای نۆ یاوەرەوە گێڕراوەتەوە، ئیمامی ئەحمەدو بوخاری و ئەبوحاتەم بە زەعیفیان داناوە بەڵام ئیمامی نەوەوی بە (حەسەن) و ئیبنوحیببان بە سەحیحیان داناوە، شێخی ئەلبانی رحمەالله دوای توێژینەوەی هەموو سەنەدەکان لە: (صحیح مشکاة المصابیح/ ٤٨٣٩)دا بە سەحیحی داناوە.

## فەرموودەی سێزدەیەم

### ئاستێکی باڵای برایەتی

عَنْ أَبِي حَمْزَةَ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ خَادِمِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَنْ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لِأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ[1].

باوکی حەمزە کە ئەنەسی کوڕی مالیکە خوا لێی ڕازی بێت، خزمەتکاری پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: کەستان ئیمانی نابێت تا ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ براکەشی پێ خۆش نەبێت.

---

١ بوخاری (١٣)، موسلیم (٤٥).

# فەرموودەی چواردەیەم

## کێ دەکوژرێت ؟!

عَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَا يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ يشهد أن لا إله إلا الله، وأني رسول الله إِلَّا بِإِحْدَى ثَلَاثٍ: الثَّيِّبُ الزَّانِي، وَالنَّفْسُ بِالنَّفْسِ، وَالتَّارِكُ لِدِينِهِ الْمُفَارِقُ لِلْجَمَاعَةِ[1] .

عبدالله کوڕی مەسعود خوا لێی ڕازی بێت فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کوشتنی هیچ موسوڵمانێک حەڵال نیە کە شایەتیدابێت کە هیچ خوایەک نییە شایانی پەرستن بێت جگە لە خوای گەورە، هەروەها شایەتییدابێت کە محمد (ﷺ) نێرراوی خوای گەورەیە، مەگەر بە سێ هۆکار: هاوسەرداری زیناکار. خوێن بو خوێن (بکوژێك بکوژرێتەوە)و کەسێك لە دین هەڵگەڕابێتەوە،و لە کۆمەڵی موسڵمانان جیابووبێتەوە.

---

١ بوخاری (٦٨٧٨)، موسلیم (١٦٧٦).

## فەرموودەی پازدەیەم

قسەی خێرو ڕێزی دراوسی و ڕێزی میوان و لە باوەڕهێنانە بەخوای گەورەو بەڕۆژی دوایی!

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاَللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَصْمُتْ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاَللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيُكْرِمْ جَارَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاَللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ[١].

ئەبوهورەیرە خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەسێ باوەڕی بە خوای گەورەو بە ڕۆژی دوایی هەیە، باقسەی خێر بکات، یاخود بێدەنگبێت. هەر کەسێ باوەڕی بە خوای گەورە و بە ڕۆژی دوایی هێناوە با ڕێزی دراوسێیەکەی بگرێت. هەر کەسێ باوەڕی بە خوای گەورە و بە ڕۆژی دوایی هێناوە با ڕێزی میوانەکەی بگرێت.

---

١ بوخاری (٦٠١٨)، موسلیم (٤٧).

## فەرموودەی شازدەیەم

هەڵمەچۆ، تورە مەبە!

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ أَنْ رَجُلًا قَالَ لِلنَّبِيِّ ﷺ أَوْصِنِي. قَالَ: لَا تَغْضَبْ، فَرَدَّدَ مِرَارًا، قَالَ: لَا تَغْضَبْ [١].

ئەبوهورەیرە خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە کە پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و عەرزیکرد: (ئامۆژگارییەکم بکە)، پێغەمبەری خوایش ﷺ فەرمووی: تورەمە. پیاوەکە چەند جارێك داواکەی دووبارە کردەوە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه هەر دەیفەرموو: تورە مەبە.

١ بوخاری (٥٧٦٥)، ترمذي (٢٠٢٠)، ئەحمەد (٢٧٣١١).

## فەرموودەی حەڤدەهەم

### ڕەفتاری چاک لەگەڵ هەموو مەخلوقێک هەر چاکەیە

عَنْ أَبِي يَعْلَى شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم قَالَ: إنَّ اللَّهَ كَتَبَ الْإِحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ، فَإِذَا قَتَلْتُمْ فَأَحْسِنُوا الْقِتْلَةَ، وَإِذَا ذَبَحْتُمْ فَأَحْسِنُوا الذِّبْحَةَ، وَلْيُحِدَّ أَحَدُكُمْ شَفْرَتَهُ، وَلْيُرِحْ ذَبِيحَتَهُ[١].

ئەبویەعلا کە شەددای کوڕی ئەوسە، خوا لێی ڕازی بێت لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: خوای گەورە فەرمانی بە چاکە ــبەرامبەر بەهەموو شتێك ــ داوە، کە گیانلەبەرێکتان کوشت، بە شیوەیەکی جوان بیکوژن، کە شتێک سەردەبڕن (دەکوژنەوە) بە شێوەیەکی جوان سەریببڕن. با ئەوی سەردەبڕێت چەقۆکەی باش تیژبکات تا سەربڕاوەکەی بحەسێنێتەوە. (تا خێرا گیانی دەرچێت و لە ئازارکێشان قوتاریببێت).

---

١ موسلیم (١٩٥٥)، ئەبوداوود (٢٨١٥)، ترمذی (١٤٠٩)، نەسائی (٤٤٠٥)، ئیبنوماجە (٣١٧٠).

## فەرموودەی هەژدەیەم

له هەرشوێنێك بوویت پارێزكاری له سنوورەكانی خوا بكه

عَنْ أَبِي ذَرٍّ جُنْدَبِ بْنِ جُنَادَةَ، وَأَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: اتَّقِ اللَّهَ حَيْثُمَا كُنْت، وَأَتْبِعْ السَّيِّئَةَ الْحَسَنَةَ تَمْحُهَا، وَخَالِقْ النَّاسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ[١] .

ئەبوذەڕ كه جوندەبی كوڕی جونادەیه، و باوكی عبدالرحمن موعازی كوڕی جەبەل خوا لێیان رازی بێت له پێغەمبەری خواوه ﷺ گێڕاویەتیانەوه كه فەرموویەتی: له هەر شوێنێك بوویت ترسی خوات له دڵدا بێت و پارێزكاری سنوورەكانی خوای گەوره به، دوای هەر خراپەیەكیش چاكەیەك بكه ت ابیسڕێتەوه، بەشێوەیەكی جوانیش ڕەفتار لەگەڵ خەڵكییدا بكه.

---

١ ترمذی (٢٥٠٧)، دەشفەرموێ: (حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ)، ئیبنوماجه (٤٠٣٢)، ئەحمەد (٢٠٨٤٧)، داریمی (٢٧٩١)، حاكم (١٨٣) دەربارەشی فەرموویەتی: (هذا حديث صحيح على شرط الشيخين ، ولم يخرجاه). شێخی ئەلبانی رحمەالله له (سلسلة الأحاديث الصحيحة/ ٩٣٩)دا دەفەرموێ: سەحیحه.

## فەرموودەی نۆزدەهەم

دینی خوا بپارێزە خوا دەتپارێزێت!

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كُنْت خَلْفَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَوْمًا، فَقَالَ: يَا غُلَامِ! إنِّي أُعَلِّمُك كَلِمَاتٍ: احْفَظْ اللَّهَ يَحْفَظْك، احْفَظْ اللَّهَ تَجِدْهُ تُجَاهَك، إذَا سَأَلْت فَاسْأَلْ اللَّهَ، وَإِذَا اسْتَعَنْت فَاسْتَعِنْ بِاَللَّهِ، وَاعْلَمْ أَنَّ الْأُمَّةَ لَوْ اجْتَمَعَتْ عَلَى أَنْ يَنْفَعُوك بِشَيْءٍ لَمْ يَنْفَعُوك إلَّا بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللَّهُ لَك، وَإِنْ اجْتَمَعُوا عَلَى أَنْ يَضُرُّوك بِشَيْءٍ لَمْ يَضُرُّوك إلَّا بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَيْك؛ رُفِعَتْ الْأَقْلَامُ، وَجَفَّتْ الصُّحُفُ[١].

عبداللّٰەی کوڕی عەبباس خوا لێیان رازی بێت، فەرمووی: ڕۆژێکیان لە دوای پێغەمبەری خواوە ﷺ بووم، پێی فەرمووم: ڕۆڵە! من چەند وتەیەکت فێردەکەم: تۆ (سنوورەکانی) خوا بپارێزە، خوای گەورە

---

١ترمذی (٢٥١٦)، دەشفەرموێ: (حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ)، ئەحمەد (٢٣٣/٤)، شێخی ئەلبانی رحمەاللە لە: (صحيح الترمذي/ ٢٥١٦)و لە: (صحيح الجامع الصغير/٧٩٥٧)دا دەفەرموێ: سەحیحە.

دەتپارێزێت. خوای گەورە بپارێزە، دەبینیت خوای گەورە رووەورووتە. ئەگەر داواتکرد، داوا هەر لە خوای گەورە بکە. کە داوای یارمەتییت کرد، هەر لە خوای گەورەی داوابکە. لەوە دڵنیابە کە ئەگەر هەر هەموو خەڵکی کۆببنەوە تا بەشتێك سوودت پێبگەیەنن، ناتوانن سوودت پێبگەیەنن، مەگەر بەشتێك کە خوا بۆی نوسیبیت. ئەگەر هەر هەمووشیان کۆببنەوە لەسەر ئەوەی زیانێکت پێبگەیێنن، ناتوانن هیچ زیانکت پێبگەیێنن، مەگەر بەشتێك کە خوا لە چارەتی نوسی بیت. قەڵەمەکان هەڵگیراونەتەوەو (نووسینی) پەڕەکانیش وشکبوونەتەوە.

## فەرموودەی بیستەم

### مادام شەرم ناکەیت چی دەکەیت بیکە

عَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ عُقْبَةَ بْنِ عَمْرٍو الْأَنْصَارِيِّ الْبَدْرِيِّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إنَّ مِمَّا أَدْرَكَ النَّاسُ مِنْ كَلَامِ النُّبُوَّةِ الْأُولَى: إذَا لَمْ تَسْتَحِ فَاصْنَعْ مَا شِئْت[1].

عبداللە کوڕی مەسعود، کە عوقبەی کوڕی عەمری ئەنصارییە، خوا لێی ڕازی بێت، یەکێکە لەوانەی کە لە غەزای بەدردا بەشداربووە. فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڕاستی ئەوەی لە وتەی پێشووی پێغەمبەرانی خوا ماوەتەوەو گەیشتووە بەخەڵك، ئەوەیە کە : ئەگەر شەرمت نەکرد، هەرچی دەکەیت بیکە.

---

١بوخاری (٣٤٨٣)، ئەبوداوود (٤٧٩٦)، ئیبنوماجە (٤١٨٣)، ئەحمەد (٢١٨٤٠).

## فەرموودە بیست و یەکەم

### باوەڕی دامەزراوو دینداریی بەردەوام

عَنْ أَبِي عَمْرٍو وَقِيلَ: أَبِي عَمْرَةَ سُفْيَانَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵁ قَالَ: قُلْت: يَا رَسُولَ اللَّهِ! قُلْ لِي فِي الْإِسْلَامِ قَوْلًا لَا أَسْأَلُ عَنْهُ أَحَدًا غَيْرَك؛ قَالَ: قُلْ: آمَنْت بِاَللَّهِ ثُمَّ اسْتَقِمْ[1].

له عبداللّهی کوڕی عومەرەوە، دەشڵێن لە ئەبی عەمرە سوفیانی کوڕی عبداللّەوە، خوا لێیان رازی بێت فەرمووی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا لە بارەی ئیسلامەوە شتێکم پێ بفەرموو کە جگە لە جەنابت پێویستم نەبێ لە کەسیتر بپرسمەوە. فەرمووی: بڵێ: باوەڕم بە خوای گەورە هێناوەو پاشان لەسەری بەردەوام بە.

---

١ موسلیم (٣٨)، ترمذی (٢٤١٠)، ئیبنوماجە (٣٩٧٢)، ئەحمەد (١٨٩٣٨).

## فەرموودەی بیست و دووەم

هەر بە پێنج فەرزەکە دەچیتە بەهەشت!

عَنْ أَبِي عَبْدِ اللَّهِ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْأَنْصَارِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ رَجُلًا سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: أَرَأَيْت إذَا صَلَّيْت الْمَكْتُوبَاتِ، وَصُمْت رَمَضَانَ، وَأَحْلَلْت الْحَلَالَ، وَحَرَّمْت الْحَرَامَ، وَلَمْ أَزِدْ عَلَى ذَلِكَ شَيْئًا؛ أَأَدْخُلُ الْجَنَّةَ؟ قَالَ: نَعَمْ[1].

باوکی عبدالله جابری کوڕی عبدالله ئەنصاری، خوا لێیان رازی بێت. فەرمووی: پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد: ئەگەر تەنها نوێژە فەرزەکان بکەم و لە ڕەمەزاندا بەڕۆژوو بم. و حەڵاڵ بە حەڵاڵ بزانم (بیکەم) و حەڕامیش بە حەڕام بزانم و (توخنی نەکەوم). جگە لەمانە هیچیتری زیادە نەکەم؛ ئایا دەچمە بە هەشت؟! پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: بەڵێ.

---

١ موسلیم (١٥)، ئەحمەد (٣٨٣٤٨)، بەیهیقی (١٨١٤٢).

# فەرموودەی بیست و سێیەم

قورئان، بەڵگەیەکە بۆت یان بەڵگەیەکە لەسەرت.

عَنْ أَبِي مَالِكٍ الْحَارِثِ بْنِ عَاصِمٍ الْأَشْعَرِيِّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الطَّهُورُ شَطْرُ الْإِيمَانِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ تَمْلَأُ الْمِيزَانَ، وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ تَمْلَآنِ -أَوْ: تَمْلَأُ- مَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ، وَالصَّلَاةُ نُورٌ، وَالصَّدَقَةُ بُرْهَانٌ، وَالصَّبْرُ ضِيَاءٌ، وَالْقُرْآنُ حُجَّةٌ لَك أَوْ عَلَيْك، كُلُّ النَّاسِ يَغْدُو، فَبَائِعٌ نَفْسَهُ فَمُعْتِقُهَا أَوْ مُوبِقُهَا[١].

ئەبومالیك كە حاریثی كوڕی عاصیمی ئەشعەرییە خوا لێی ڕازی بێت فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: پاکژیی نیوەی باوەڕەو الحمدلله (سوپاسگوزاری خوای گەورە) مایەی پڕكردنەوەی تای تەرازووی چاكەكارییەو (سبحان الله و الحمدلله) نێوانی ئاسمان و زەوی پڕدەكەنەوە.

---

١ موسلیم (٢٢٣)، ترمذی (٣٥١٧)، نەسائی (٢٤٣٧)، ئیبنوماجە (٢٨٠)، ئەحمەد (٢٢٤٠١).

نوێژ نووره. بەخشینیش بەڵگەی ڕاستێتی باوەڕە. ئارامگرتن ڕووناکییە. قورئانیش بەڵگەی بەرگرییە لیت، یان بەلگەیە لەسەرت. هەموو خەڵکی ڕۆژانە بە کاری خۆیانەوە خەریکدەبن. هەیانە خۆی بە خوای گەورە دەفرۆشێت (بەوەی فەرمانەکانی خوای گەورە جێبەجێدەکات و خۆ لە گوناح دەپاریزێت) بەمەش نەفسی خۆی لە دیللی قوتاردەکات. هەشیانە خۆی پیس و چڵکن دەکات (بەوەی نەفسی خۆی لە گوناح هەڵدەکێشێت) و خۆی بە فەتارەت دەبات.

## فەرموودەی بیست چوارەم

### جگە لەخۆت لۆمەی کەسی تر مەکە

عَنْ أَبِي ذَرٍّ الْغِفَارِيِّ ﷺ عَنْ النَّبِيِّ ﷺ فِيمَا يَرْوِيهِ عَنْ رَبِّهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى، أَنَّهُ قَالَ: يَا عِبَادِي: إِنِّي حَرَّمْت الظُّلْمَ عَلَى نَفْسِي، وَجَعَلْته بَيْنَكُمْ مُحَرَّمًا؛ فَلَا تَظَالَمُوا. يَا عِبَادِي! كُلُّكُمْ ضَالٌّ إلَّا مَنْ هَدَيْته، فَاسْتَهْدُونِي أَهْدِكُمْ. يَا عِبَادِي! كُلُّكُمْ جَائِعٌ إلَّا مَنْ أَطْعَمْته، فَاسْتَطْعِمُونِي أُطْعِمْكُمْ. يَا عِبَادِي! كُلُّكُمْ عَارٍ إلَّا مَنْ كَسَوْته، فَاسْتَكْسُونِي أَكْسُكُمْ. يَا عِبَادِي! إنَّكُمْ تُخْطِئُونَ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ، وَأَنَا أَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا؛ فَاسْتَغْفِرُونِي أَغْفِرْ لَكُمْ. يَا عِبَادِي! إنَّكُمْ لَنْ تَبْلُغُوا ضُرِّي فَتَضُرُّونِي، وَلَنْ تَبْلُغُوا نَفْعِي فَتَنْفَعُونِي. يَا عِبَادِي! لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ كَانُوا عَلَى أَتْقَى قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ مِنْكُمْ، مَا زَادَ ذَلِكَ فِي مُلْكِي شَيْئًا. يَا عِبَادِي! لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ كَانُوا عَلَى أَفْجَرِ قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ مِنْكُمْ، مَا

نَقَصَ ذَلِكَ مِنْ مُلْكِي شَيْئًا. يَا عِبَادِي! لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ قَامُوا فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ، فَسَأَلُونِي، فَأَعْطَيْت كُلَّ وَاحِدٍ مَسْأَلَته، مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِمَّا عِنْدِي إلَّا كَمَا يَنْقُصُ الْمِخْيَطُ إذَا أُدْخِلَ الْبَحْرَ. يَا عِبَادِي! إنَّمَا هِيَ أَعْمَالُكُمْ أُحْصِيهَا لَكُمْ، ثُمَّ أُوَفِّيكُمْ إيَّاهَا؛ فَمَنْ وَجَدَ خَيْرًا فَلْيَحْمَدْ اللَّهَ، وَمَنْ وَجَدَ غَيْرَ ذَلِكَ فَلَا يَلُومَن إلَّا نَفْسَهُ[1].

ئەبو ذەری غیفاریی خوا لێی ڕازی بێت لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم گێڕوایەتیەوەو پێغەمبەری خوایش ﷺ لە خوای گەورەوە گێڕوایەتییەوە کە فەرموویەتی: ئەی بەندەکانم! من ستەمم لەسەر خودی خۆم قەدەغەکردووە، لە ناو ئێوەشدا حەرامکردووە، جا ستەممەکەن. ئەی بەندەکانم! هەر هەمووتان گومڕان مەگەر ئەوەی من ڕێنموییم کردبێت، بۆیە دوای ڕێنموییی لە من بکەن، تا هیدایەتتانبدەم. ئەی بەندەکانم، هەمووتان برسیین مەگەر ئەوەی من خۆراکم پێبدابێت، بۆیە داوای ڕۆزیی هر لە من

---

[1] موسلیم (٢٥٧٧)، ترمذی (٢٤٩٥)، ئیبنوماجە (٤٢٥٧)،ئەحمەد (١٦٠/٥).

بکەن، تا پێتانبدەم. ئەی بەندەکانم! هەمووتان ڕووتن مەگەر ئەوەی من پۆشیبێتم، بۆیە داوای پۆشاکم لە من بکەن، تا پۆشتەتانکەم. ئەی بەندەکانی من! ئێوە بە شەوو ڕۆژ هەڵەو سەرپێچی من دەکەن، منیش لە هەموو تاوانێك خۆشدەبم، بۆیە داوای لێخۆشبوون لە من بکەن، تا لێتان خۆش بم. ئەی بەندەکانم ئێوە هەرگیز ناگەن بە ئاستی زیانگەیاندن بە من، تا زیانم پێبگەێنن. هەرگیز ناشگەن بە ئاستی سوودگەیاندن بەمن، تا سوودم پێبگەینن. ئەی بەندەکانم ئەگەر دوابەیەکتان بە مرۆڤ و پەرییتانەوە لەسەر پاکترین و پارێزکارترین دڵی یەکێکتان بن؛ ئەوە یەك دەنك لە موڵکی من زیادناکات. ئەی بەندەکانم! ئەگەر سەرەتاو کۆتاییتان، ئادەمیزاد و جنۆکەتان لەسەر پیسترین و خراپەکارترین دڵی یەکێکتان بن، ئەوە تۆسقاڵێك لە موڵکی من کەمناکات. ئەی بەندەکانم ئەگەر یەکەمین و دواهەمینتان بە تێکڕای مرۆڤ و جنۆکەتانەوە لە یەك گۆڕەپاندا بوەستن و داخوازییەکانی خۆتانم لێ داوابکەن، هەریەکێکیشتان ئەوەی داوایدەکات پێیببەخشم، ئەوەی لای منە هیچی لێ کەمنابێتەوە، دەرزییەك بکرێت بە دەریایەکدا چەند ئاوی دەریاکە کەمدەکاتەوە، بەخشینی داواکارییەکانتان بە

ئەندازەی ئەوە لە مولْکی من کەمدەکاتەوە. ئەی بەندەکانم ئەوە کاروکردەوەکانی خۆتانە کە بۆتانی هەژمارو تۆماردەکەم، بە ئەمانەت دەیپارێزم و هەر یەکەتان هەقی خۆی دەدەمەوە، ئەگەر کەسێك چاکەی دەستکەوت. با سوپاسی خوای گەورەی لەسەر بکات. هەر کەسێکیش غەیری چاکەی دەستکەوت. با جگە لە خۆی لۆمەی کەسیتر نەکات.

## فەرموودەی بیست و پێنجەم

### هەموو رەنجێکی بواری چاکە، خێرە

عَنْ أَبِي ذَرٍّ رضي الله عنه أَيْضًا، أَنَّ نَاسًا مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالُوا لِلنَّبِيِّ ﷺ يَا رَسُولَ اللَّهِ ذَهَبَ أَهْلُ الدُّثُورِ بِالْأُجُورِ؛ يُصَلُّونَ كَمَا نُصَلِّي، وَيَصُومُونَ كَمَا نَصُومُ، وَيَتَصَدَّقُونَ بِفُضُولِ أَمْوَالِهِمْ. قَالَ: أَوَلَيْسَ قَدْ جعَلَ اللَّهُ لَكُمْ مَا تَصَّدَّقُونَ؟ إنَّ بِكُلِّ تَسْبِيحَةٍ صَدَقَةً، وَكُلِّ تَكْبِيرَةٍ صَدَقَةً، وَكُلِّ تَحْمِيدَةٍ صَدَقَةً، وَكُلِّ تَهْلِيلَةٍ صَدَقَةً، وَأَمْرٌ بِمَعْرُوفٍ صَدَقَةٌ، وَنَهْيٌ عَنْ مُنْكَرٍ صَدَقَةٌ، وَفِي بُضْعِ أَحَدِكُمْ صَدَقَةٌ. قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيَأْتِي أَحَدُنَا شَهْوَتَهُ وَيَكُونُ لَهُ فِيهَا أَجْرٌ؟ قَالَ: أَرَأَيْتُمْ لَوْ وَضَعَهَا فِي حَرَامٍ أَكَانَ عَلَيْهِ وِزْرٌ؟ فَكَذَلِكَ إذَا وَضَعَهَا فِي الْحَلَالِ، كَانَ لَهُ أَجْرٌ. [١]

له ئەبو زەڕ خوا لێی ڕازی بێت فەرمووی: هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بە پێغەمبەریان فەرموو: ئەی پێغەمبەر هەرچی پاداشت

---

١ موسلیم (١٠٠٦)، ئیبنوماجە (٩٢٧)، ئەحمەد (٢٠٩١٧)، ئیبنوحەجەر: فتح الباري (٨٠٧)،

هەیە دەوڵەمەندەکان بۆخۆیان بردووە، ئەوان بەهەمان شێوەی ئێمە نوێژدەکەن، وەکو ئێمە بەڕۆژوو دەبن، ماڵەکانیان دەکەنەخێر. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەدی خوای گەورە ڕێیێتری نیشان ئێوە نەداوە تا لەوێوە خێربکەن؟! دڵنیابن کە هەموو تەسبیحەیەک (وتنی سبحان الله)یەك خێرو چاکەیە، هەموو تەکبیرێک (وتنی الله اکبر)ێك خێرو چاکەیە، هەموو تەحمیدەیەک (وتنی الحمدلله) خێرو چاکەیە، فەرمان بەچاکە خێرو چاکەیە، ڕێگرتن لەخراپە خێرو چاکەیە، تەنانەت کاری سەرجێییشتان لەگەڵ هاوسەرەکانتاندا خێرو چاکەیە، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا کەسێك کە ئارەزووی خۆی دامرکێنێتەوە، پاداشتی دەستدەکەوێت؟!. فەرمووی: ئەدی ئەگەر ئەو ئارەزووەی لەحەرامدا دانێت چی؟ (مەگەر تاوانبار نابێت؟!)، ئێ هەر ئاوا ئەگەر لە حەڵاڵدا بەکاریهێنا پاداشتی دەستدەکەوێت.

## فەرموودەی بیست و شەشەم

### ئازارلادان لەسەر ڕێ

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ كُلُّ سُلَامَى مِنْ النَّاسِ عَلَيْهِ صَدَقَةٌ، كُلَّ يَوْمٍ تَطْلُعُ فِيهِ الشَّمْسُ تَعْدِلُ بَيْنَ اثْنَيْنِ صَدَقَةٌ، وَتُعِينُ الرَّجُلَ فِي دَابَّتِهِ فَتَحْمِلُهُ عَلَيْهَا أَوْ تَرْفَعُ لَهُ عَلَيْهَا مَتَاعَهُ صَدَقَةٌ، وَالْكَلِمَةُ الطَّيِّبَةُ صَدَقَةٌ، وَبِكُلِّ خُطْوَةٍ تَمْشِيهَا إِلَى الصَّلَاةِ صَدَقَةٌ، وَتُمِيطُ الْأَذَى عَنْ الطَّرِيقِ صَدَقَةٌ[1].

ئەبوهورەیرە خوا لێی ڕازی بێت فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: تەواوی جومگەکانی مرۆڤ خێریان لەسەرە بیکەن، لەگەڵ هەڵهاتنی گزنگی خۆری هەر ڕۆژێك، ئاشتەوایی لە نێوان دوو کەسی لێکزویردا بکەیت، خێرێکە. یارمەتی کەسێك بۆ سواربوونی سوارییەکەی خێرێکە. دەستیاریی و دەستباریی بۆ بارلێنانی سوارییەکەی

---

١ بوخاری (٢٧٠٧)، موسلیم (١٠٠٩).

بکەیت، خێرێکە. کردنی قسەی چاك خێرێکە. هەر هەنگاوێك کە بەرەو نـوێژکردن هەڵیـدەهێنیتەوە خێـرێکە. هەر شـتێک کە ئـازار بە خەڵکـی دەگەێنێت لەسەر ڕێ لابدەیت خێرێکە.

## فەرموودەی بیست و حەفتەم

### فەتوای ویژدانت

عَنْ النَّوَّاسِ بْنِ سَمْعَانَ ﵁ عَنْ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الْبِرُّ حُسْنُ الْخُلُقِ، وَالْإِثْمُ مَا حَاكَ فِي صَدْرِك، وَكَرِهْت أَنْ يَطَّلِعَ عَلَيْهِ النَّاسُ[1]. وَعَنْ وَابِصَةَ بْنِ مَعْبَدٍ ﵁ قَالَ: أَتَيْت رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم فَقَالَ: جِئْتَ تَسْأَلُ عَنْ الْبِرِّ؟ قُلْت: نَعَمْ. فقَالَ: استفت قلبك، الْبِرُّ مَا اطْمَأَنَّتْ إلَيْهِ النَّفْسُ، وَاطْمَأَنَّ إلَيْهِ الْقَلْبُ، وَالْإِثْمُ مَا حَاكَ فِي النَّفْسِ وَتَرَدَّدَ فِي الصَّدْرِ، وَإِنْ أَفْتَاك النَّاسُ وَأَفْتَوْك[2].

نەوواسی کوڕی سەمعان خوا لێی ڕازی بێت لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: چاکە بریتییە: لە ئاکاری جوان، تاوانیش ئەوەیە کە ناخت دەخورێنێت (ویژدانت ئازاردەدات)، کە ناتەوێت خەڵکی پێی بزانێت.

---

١ موسلیم (٢٥٥٣)، ترمذی (٢٣٨٩)، ئەحمەد (١٧٢٩٤)، داریمی (٢٧٠٤).
٢ موسلیم (٤٦٣٢)، ترمذی (٢٣٢٤)، ئەحمەد (١٧١٧٩)، داریمی (٢٧٨٩).

وابیسەی کوڕی مەعبەد خوا لێی ڕازی بێت فەرمووی: هاتمە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەویش فەرمووی: هاتووی لەبارەی چاکەوە پرسیار بکەیت؟ عەرزمکرد: بەڵێ. فەرمووی: پرسیار لە دڵت بکە. چاکە ئەوەیە کە دڵ و دەروون ئارامدەکات (ویژدانت ئاسوودە دەکات)، خراپەش ئەوەیە کە دەروونت دەهەژێنێت و لەسینەتدا ڕاڕاییت بۆ دروستدەکات (ویژدانت ئازاردەدات)، ئەگەرچی پرست بە خەڵکی کردبێت و خەڵکیش فەتوایان بۆ دابێت.

## فەرموودەی بیست و هەشتەم

وەسییەتتان دەکەم بە پارێزکاریی

عَنْ أَبِي نَجِيحٍ الْعِرْبَاضِ بْنِ سَارِيَةَ ﵁ قَالَ: وَعَظَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَوْعِظَةً وَجِلَتْ مِنْهَا الْقُلُوبُ، وَذَرَفَتْ مِنْهَا الْعُيُونُ، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ! كَأَنَّهَا مَوْعِظَةُ مُوَدِّعٍ فَأَوْصِنَا، قَالَ: أُوصِيكُمْ بِتَقْوَى اللَّهِ، وَالسَّمْعِ وَالطَّاعَةِ وَإِنْ تَأَمَّرَ عَلَيْكُمْ عَبْدٌ، فَإِنَّهُ مَنْ يَعِشْ مِنْكُمْ فَسَيَرَى اخْتِلَافًا كَثِيرًا، فَعَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيينَ، عَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ، وَإِيَّاكُمْ وَمُحْدَثَاتِ الْأُمُورِ؛ فَإِنَّ كُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ.[1]

---

[1] ئەبوداوود (٤٦٠٧)، ترمذی (٢٦٧٦)، دەشفەرموێ: (حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ)، ئیبنوماجە (٤٤)، ئەحمەد (١٦٦٩٢)، داریمی (٩٦)، طەبەرانی (٦١٧/١٨)، بەغەوی لە: (شرح السنة/١٠٢). سەیرە کە هەندێک لە زانایانی سەر بە دەسەڵاتی سیاسی لەم سەردەمەدا ئەم فەرموودەیان بە زەعیف داناوە، لە کاتێکدا کە کۆمەڵێکی زۆر لە فەرموودەوانان و توێژەرەوانی فەرموودە بە سەحیحیان داناوە، لەوانە: ئیبنوعەبدولبەڕ لە: جامع بیان العلم وفضله ١١٦٤/٢)، حاکمی نەیسابووری: (المستدرک/ ٣٢٩و ٣٣١و ٣٣٣)، ئیبنوحیببان: (صحيح ابن حبان. المقدمة ژمارە: ٥)، بەغەوی: (شرح

له باوکی نەجیح عیربازی کوری سارییە خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری بۆ دەداین، و دڵەکان تێیدا دەهاتنە هەژان، و ئەسرینی لەچاوان دەهێنایە خوار، هەر دەت ووت ووتاریی ماڵئاوییەو وەسیەتمان بۆ دەکات. فەرمووی: وەسیەتتان دەکەم کە پارێزکاری (لە سنوورەکانی) خوا بکەن، وە گوێڕایەڵ و ملکەچی (ئەمیرەکانتان) بن، با ئەمیرەکەشتان بەندەیەك بێت!، چونکە ئەوەی لەناوتان بژی ڕاجیاییەکی زۆر دەبینێت، بۆیە لەسەرتانە کە شوێنکەوتنەی سوننەتی من و ڕێبازی جێنشینە ڕاشیدە و ڕێنموویکراوەکان بن، بەموو لێی لامەدەن، وە ئاگان خۆتان لە داهێنراوەکان بەدوور بگرن، لەبەر ئەوەی هەموو داهێنراوێك گومڕاییە.

---

السنة ١٨١/١)، بەیهیقی لە (دلائل النبوة ٥٤١/٦)، موندری لە: (الترغیب والترهیب ٦٠/١)، ئیبنوتەیمییە لە: (مجموع الفتاوی ٦٢٢/١١)، لەم سەردەمەشدا شەوکانی لە: (السیل المتفق الجرار ١٠٤/٢) و ئیبن باز: (مجموع فتاوی ابن باز ٣١٧/٦) و ئەلبانی لە: (صحیح سنن ابن ماجە ٤٢/٢) رحمهم الله.

## فەرموودەی بیست و نۆیەم

### زمانت بگرە

عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﵁ قَالَ: قُلْت يَا رَسُولَ اللَّهِ! أَخْبِرْنِي بِعَمَلٍ يُدْخِلُنِي الْجَنَّةَ وَيُبَاعِدْنِي مِنْ النَّارِ، قَالَ: لَقَدْ سَأَلْت عَنْ عَظِيمٍ، وَإِنَّهُ لَيَسِيرٌ عَلَى مَنْ يَسَّرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ: تَعْبُدُ اللَّهَ لَا تُشْرِكْ بِهِ شَيْئًا، وَتُقِيمُ الصَّلَاةَ، وَتُؤْتِي الزَّكَاةَ، وَتَصُومُ رَمَضَانَ، وَتَحُجُّ الْبَيْتَ، ثُمَّ قَالَ: أَلَا أَدُلُّك عَلَى أَبْوَابِ الْخَيْرِ؟ الصَّوْمُ جُنَّةٌ، وَالصَّدَقَةُ تُطْفِئُ الْخَطِيئَةَ كَمَا يُطْفِئُ الْمَاءُ النَّارَ، وَصَلَاةُ الرَّجُلِ فِي جَوْفِ اللَّيْلِ، ثُمَّ تَلَا: تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ حَتَّى بَلَغَ يَعْمَلُونَ، ثُمَّ قَالَ: أَلَا أُخْبِرُك بِرَأْسِ الْأَمْرِ وَعَمُودِهِ وَذُرْوَةِ سَنَامِهِ؟ قُلْت: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: رَأْسُ الْأَمْرِ الْإِسْلَامُ، وَعَمُودُهُ الصَّلَاةُ، وَذُرْوَةُ سَنَامِهِ الْجِهَادُ، ثُمَّ قَالَ: أَلَا أُخْبِرُك بِمَلَاكِ ذَلِكَ كُلِّهِ؟ فقُلْت: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ! فَأَخَذَ بِلِسَانِهِ وَقَالَ: كُفَّ عَلَيْك هَذَا. قُلْت: يَا نَبِيَّ اللَّهِ وَإِنَّا لَمُؤَاخَذُونَ بِمَا نَتَكَلَّمُ بِهِ؟

فَقَالَ: ثَكِلَتْك أُمُّك وَهَلْ يَكُبُّ النَّاسَ عَلَى وُجُوهِهِمْ -أَوْ قَالَ عَلَى مَنَاخِرِهِمْ- إِلَّا حَصَائِدُ أَلْسِنَتِهِمْ؟![1].

له موعازی کوڕی جەبەلەوە خوا لێی ڕازی بێت. دەفەرموێ: ووتم ئەی پێغەمبەری خوا کارێکم پێ بفەرموو کە بەرەو بەهەشتم ببات و لە دۆزەخم دوورمبخاتەوە. ئەویش فەرمووی: بەڕاستی پرسیارت لە بارەی شتێکی گەورەوە کرد، بەڵام ئەمە ئاسانە بۆ هەر کەسێك کە خوای گەورە بۆی ئاسانبکات: بەندایەتی خوا بکە هیچ هاوەڵێکی بۆ دامەنێ و نوێژەکانتبکە، زەکاتبدە، ڕۆژووی ڕەمەزان بگرە، حەجبکە. دواتر فەرمووی: پێتبڵێم دەروازەکانی چاکە چین؟ ڕۆژوو قەڵغانە، ــوەکو چۆن ئاو ئاگر دەکوژێنێتەوەــ ماڵبەخشینیش ئاوا خراپەکانت دەسڕێتەوە،. ئینجا ئەو شەونوێژەی کە لە ناوەڕاستی شەودا دەکرێت، پاشان ئەم ئایەتەی

---

[1] ترمذی(٢٦١٦)، دەشفەرموێ: (حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ)، ئیبنوماجە (٣٩٧٣)، ئەحمەد (٢٣١/٥)، بەیهیقی لە: (السنن الكبرى/١٧٢٤٠، شێخی ئەلبانی رحمەالله لە (إرواء الغليل/٤١٣ )دا دەفەرموێ: سەحیحە.

خوێندەوە (تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ) تا گەیشتە (يَعْمَلُونَ)[1] دواتر فەرمووی: پێت بڵێم ترۆپکی بەرزو لوتکەی بڵندو ستوونی ئەم دینە چییە؟ وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ترۆپکی هەموو کارێکی خێر موسوڵمانێتییە (تەسلیمبوونە بە خوای گەورە)، ستوونی ئەم دینە نوێژەکانە، لوتکە بڵندەکەشی جیهادەکەیە. دواتر فەرمووی: ئەی پێت بڵێم چۆن هەموو ئەوانە دەستدەخەیت؟ عەرزمکرد: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا. جەنابی دەستی بەزمانییەوە گرت و فەرمووی: ئاگەداری ئا ئەمە بە. وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، چما قسەکردنیشمان دەبێتە هۆی سزامان؟ فەرمووی : هەی دایکت رۆڵەڕۆت بۆ بکات، مەگەر ئەوانەی لەسەر ڕوویان ڕادەکێشرێن (یان بە لووت رادەکێشرێن) بۆ دۆزەخ هەر لەبەر ئەوە نییە کە زمانیان بەرهەمی هێناوە؟!

---

١ سوورەتی السجدة/ ١٦_١٧: (تَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ. فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّا أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ)

# فەرموودەی سییەم

به سنووری دینه کەوه پابەندبه، بەسته

عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ الْخُشَنِيِّ جُرْثُومِ بن نَاشِبٍ رضي الله عنه عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم قَال: إنَّ اللَّهَ تَعَالَى فَرَضَ فَرَائِضَ فَلَا تُضَيِّعُوهَا، وَحَدَّ حُدُودًا فَلَا تَعْتَدُوهَا، وَحَرَّمَ أَشْيَاءَ فَلَا تَنْتَهِكُوهَا، وَسَكَتَ عَنْ أَشْيَاءَ رَحْمَةً لَكُمْ غَيْرَ نِسْيَانٍ فَلَا تَبْحَثُوا عَنْهَا[1].

باوکی ثەعلەبەی خوشەنی کە جەرثومی کوڕی ناشیبە خوا لێی رازی بێت هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوای گەورە چەند فەرزێکی داناوە مە یانچوێنن و (جێبەجێیان بکەن ومەیانفەوتێنن). چەند سنوورێکیشی دیاریکردووە مە یانبەزێنن و (لێیان دەرمەچن). چەند شتێکیشی حەرام کردووە توخنیانمەکەون. لەبەزە

[1] دارەقوطنی (٤٣١٦)، ئیبنوعەبدولبەڕ لە: (جامع العلوم والحكم/ فەرموودەی سییەم ١٥٠/٢). ئیمامی ذەهەبی لە (المهذب/٣٩٧٦/٨) و ئیمامی ئیبنوحەجەر لە: ( المطالب العالية ٢٧١/٣)و شێخی ئەلبانی لە: (صعيف الجامع الصغير/١٥٩٧)دا بە زەعیفیان داناوە.

ی خۆشیەوە لە هەندێك  شت ــبێ بیرچوونەوەــ بێدەنگبووە، ئێوەش زۆر لێیمە کۆڵنەوە. (ئەوەندە بە دوایاندا مەڕۆن و سەختگیرانە بیانگرنەبەر، پاشان نەتوانن پێیانەوە پابەند بمێنن).

## فەرموودەی سیی و یەکەم

### چاوت لە ماڵی خەڵکی نەبێت

عَنْ أَبِي الْعَبَّاسِ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيّ ﵁ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! دُلَّنِي عَلَى عَمَلٍ إذَا عَمِلْتُهُ أَحَبَّنِي اللَّهُ وَأَحَبَّنِي النَّاسُ؛ فَقَالَ: ازْهَدْ فِي الدُّنْيَا يُحِبُّك اللَّهُ، وَازْهَدْ فِيمَا عِنْدَ النَّاسِ يُحِبُّك النَّاسُ .[1]

لە باوکی عەباسەوە، کە سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدییە خوا لێی ڕازی بێت. دەفەرمووێ: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و عەرزیکرد: ئەی پێغەمبەری خوا کارێکم پێ بفەرموو ئەگەر ئەنجامیدا، خوای گەورە خۆشیبوێم، هەروەها خەڵك خۆشییان بوێم؟

---

١ئیبنوماجە (٤١٠٢) بە سەنەدی (حەسەن)،طەبەرانی لە: (المعجم الكبير/٥٩٧٢)، بەیهیقی لە: (شعب الإيمان/ ١٠٠٤٣). شێخی ئەلبانی رحمەالله لە (سلسلة الأحاديث الصحيحة/٩٤٤)دا دەفەرموێ: سەحیحە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دنیانەویست بە، خوا خۆشیدەوێت.

چاوت لە ماڵی خەڵکی نەبێت، خەڵك خۆشیاندەوێت.

## فەرموودەی سیی و دووەم

نە زیانت پێبگاو نەزیان بگەیەنە

عَنْ أَبِي سَعِيدٍ سَعْدِ بْنِ مَالِكِ بْنِ سِنَانٍ الْخُدْرِيّ ﵁ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا ضَرَرَ وَلَا ضِرَارَ[1].

لە باوکی سەعیدەوە کە سەعدی کوڕی مالیکی کوری سینانی خودرییە خوا لێی ڕازی بێت. هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نە زیانت پێبگات و نەزیان بگەیەنیت.

---

١ ئیبنوماجە (٢٣٤١)، ئەحمەد (٣١٣/١)، ئیمامی مالیک لە: (الموطأ ٧٤٦/٢)،بەیهیقی (١٥٦/٦)، طەبەرانی لە: (المعجم الكبير/١١٢٢٨)، دارەقوطنی (٢٢٨/٤)، حاکم لە: (المستدرک ٦٦/٢). شێخی ئەلبانی رحمەالله لە: (إرواء الغليل ٤١٠/٣) و لە: (سلسلة الأحاديث الصحيحة/٤٤٨/١)دا بە (صحيح لغيره) ناساندووە.

## فەرموودەی سی وسێیەم

بەڵگە لەسەر داواخوازە و سوێندیش لەسەر بەرامبەری

عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَوْ يُعْطَى النَّاسُ بِدَعْوَاهُمْ لَادَّعَى رِجَالٌ أَمْوَالَ قَوْمٍ وَدِمَاءَهُمْ، لَكِنَّ الْبَيِّنَةَ عَلَى الْمُدَّعِي، وَالْيَمِينَ عَلَى مَنْ أَنْكَرَ .[1]

عبداللّەی کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێت، دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: جا هەر کەسەو داوای مافێک بکات، کە گوایە هەقێتی ودەیەویت (بەبێ بەڵگە) بیدرێتێ، جا ئیتر هەر کەسەو دێت ــبە ناحەقــ داوای ماڵ و خوێنی خەڵکانێکیتر دەکات. بەڵام سەلماندنی ماف و ڕوونکردنەوە ــبە بەڵگەوەــ لەسەر داواخوازەو سوێندخواردنیش لەسەر داوالەسەرکراوەکەیە.

---

١موسلیم (١٧١١)، ئەبوداوود (٣٦١٩)، ترمذی (١٣٤٢)، ئیبنوماجە (٢٣٢١)، ئەحمەد (٣٢٨٢).

## فەرموودەی سی و چوارەم

گۆڕانکاری بە دینداران دەکرێ!

عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيّ ﵁ قَالَ سَمِعْت رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ رَأَى مِنْكُمْ مُنْكَرًا فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسَانِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِهِ، وَذَلِكَ أَضْعَفُ الْإِيمَانِ[1].

ئەبوسەعیدی خودریی خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ دەیفەرموو: هەر یەکێکتان خراپەیەکی بینی با بە دەست بیگۆڕێت، ئەگەر نەیتوانی بە زمانی، ئەگەر نەیتوانی با بە دڵ بیگۆڕێت، ئەمەش لە لاوازترین باوەڕەوەیە.

---

١ موسلیم (٧٣)، ئەبوداوود (٣٧٨٠)، ترمذی (٢٠٩٨)، نەسائی (٤٩٤٩)، ئیبنوماجە (٤٠١١)، ئەحمەد (١١٢٤٧).

# فەرموودەی سیی و پێنجەم

## مافی برایەتی دینی

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَا تَحَاسَدُوا، وَلَا تَنَاجَشُوا، وَلَا تَبَاغَضُوا، وَلَا تَدَابَرُوا، وَلَا يَبِعْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ، وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا، الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ، لَا يَظْلِمُهُ، وَلَا يَخْذُلُهُ، وَلَا يَكْذِبُهُ، وَلَا يَحْقِرُهُ، التَّقْوَى هَاهُنَا، وَيُشِيرُ إِلَى صَدْرِهِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، بِحَسْبِ امْرِئٍ مِنْ الشَّرِّ أَنْ يَحْقِرَ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ، كُلُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ حَرَامٌ: دَمُهُ وَمَالُهُ وَعِرْضُهُ[١].

ئەبوهورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئیرەیی بەیەکتر مەبەن و حەسوودیی مەکەن، گرانفرۆشیی بەسەر مامەڵەی یەکترییدا مەکەن، ڕقتان لەیەکتر نەبێتەوەو کینە لەیەك هە

---

١ موسلیم (٢٥٦٤)، ئەبوداوود (٣٤٣٨)، ئەحمەد (٧٦٧٠).

ڵمەگرن، پشت لەیەکتری مەکەن، زەم بەسەر سەوداو مامەڵە یەکتردا مە
کەن، ببە بەندەی خواو لەبەر ئەو ببنە برای یەکتریی، موسڵمان برای
موسڵمانە، هیچ کاتێك ستەمی لیٚ ناکات، پشتی بەرنادات و بەدرۆیناخاتە
وەو بەسووك سەیریناکات، تەقواو ترسی خوای گەورە ئالێرەدایە، ــلەگە
ڵ ووتنی ئەم فەرمایشتەیداــ سیٚ جار ئاماژەی بۆ دڵی پاکی خۆی کرد.
ئینجا فەرمووی: ئەوەندە خراپەکاریی بەسە بۆ کەسێک کە بەسووك سە
یری برا موسڵمانەکەی بکات. خوێن و ماڵ و ناموسی موسڵمان لە هەموو
موسڵمانێکیتر حەرامە.

## فەرموودەی سیی و شەشەم

### دڵنەواییکردنی براکانت

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنْ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ نَفَّسَ عَنْ مُؤْمِنٍ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ الدُّنْيَا نَفَّسَ اللَّهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ يَسَّرَ عَلَى مُعْسِرٍ، يَسَّرَ اللَّهُ عَلَيْهِ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ، وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِما سَتَرَهُ اللهُ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ ، وَاَللَّهُ فِي عَوْنِ الْعَبْدِ مَا كَانَ الْعَبْدُ فِي عَوْنِ أَخِيهِ، وَمَنْ سَلَكَ طَرِيقًا يَلْتَمِسُ فِيهِ عِلْمًا سَهَّلَ اللَّهُ لَهُ بِهِ طَرِيقًا إلَى الْجَنَّةِ، وَمَا اجْتَمَعَ قَوْمٌ فِي بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللَّهِ يَتْلُونَ كِتَابَ اللَّهِ، وَيَتَدَارَسُونَهُ فِيمَا بَيْنَهُمْ؛ إلَّا نَزَلَتْ عَلَيْهِمْ السَّكِينَةُ، وَغَشِيَتْهُمْ الرَّحْمَةُ، وَذَكَرَهُمْ اللَّهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ، وَمَنْ أَبَطْأَ بِهِ عَمَلُهُ لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ[1].

ئەبوهورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کەسێك ناخۆشییەك لە ناخۆشییەکانی دونیا، لەسەر

[1] موسلیم (٤٨٧٣)، ئەبوداوود (١٤٥٥)، ترمذی (٢٦٤٦)، ئەحمەد (٢/٥٠٠).

موسوڵمانێک لابەرێت خوای گەورە نارەحەتییەك لە نارەحەتییەکانی دووارۆژی لەسەر لادەباتەوە، هەر کەسێك نارەحەتی سەرشانی موسڵمانێك ئاسانبکات، خوای گەورە نارەحەتی دنیاو دوارۆژی لەسەر ئاساندەکاتەوە. هەر کەسێك نهێنی و هەڵەی موسڵمانێك داپۆشێت، خوای گەورە لە دنیاو دوارۆژدا نهێنی و هەڵەی دادەپۆشێتەوە. خوای گەورە لە یارمەتی بەندەکەی خۆیدا دەبێت، مادام بەندەکەی یارمەتی براکانی دەدات. هەر کەسێك ڕێیەکی فێرخوازیی زانست بگرێتەبەر تا لێیەوە فێری زانست بێت، خوای گەورە ڕێگای بەهەشتی ئاسان پێدەگرێتەبەر. کاتێک کەسانێك لە ماڵێك لە ماڵەکانی خوای گەورەدا کۆدەبنەوە تا کتێبەکەی بخوێنن و لە نێوان خۆیاندا فێریببن، خوای گەورە ئارامییان بەسەردا دەڕێژێت، و بەزەیی خوا دایاندەپۆشێت و خوای گەورە لای ئەوانەی لای خۆی باسیان بە چاکە دەکات. هەر کەسێك بە کار و کردەوەکانی بکەوێتەدوا، بە بنەماڵەو نەسەبی ناکەوێتەپێش.

## فەرموودەی سیی و حەفتەم

### هەر نیازی چاکەت هەبێت پاداشت وەردەگریت

عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِيمَا يَرْوِيهِ عَنْ رَبِّهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى، قَالَ: إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ الْحَسَنَاتِ وَالسَّيِّئَاتِ، ثُمَّ بَيَّنَ ذَلِكَ، فَمَنْ هَمَّ بِحَسَنَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا كَتَبَهَا اللَّهُ عِنْدَهُ حَسَنَةً كَامِلَةً، وَإِنْ هَمَّ بِهَا فَعَمِلَهَا كَتَبَهَا اللَّهُ عِنْدَهُ عَشْرَ حَسَنَاتٍ إِلَى سَبْعِمِائَةِ ضِعْفٍ إِلَى أَضْعَافٍ كَثِيرَةٍ، وَإِنْ هَمَّ بِسَيِّئَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا كَتَبَهَا اللَّهُ عِنْدَهُ حَسَنَةً كَامِلَةً، وَإِنْ هَمَّ بِهَا فَعَمِلَهَا كَتَبَهَا اللَّهُ سَيِّئَةً وَاحِدَةً[١].

عبداللّٰەی کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ، لە خوای پەروەردگاری خۆیەوە گێڕاویێتیەوە کە: خوای گەورە چاکەو خراپەی داناوە، پاشان لێکی جیاکردوونەتەوە، هەر

---

١ بوخاری (٦١٢١)، موسلیم (١٣١).

کەسێ ویستی وا بێت کە چاکەیەك ئەنجامبدات، بتوانێت ئەنجامیشیبدات. ئەوە خوای گەورە دە تا حەوت سەد قات چاکەی زیاتری بۆ هەژماردەکات. ئەگەر نیازی خراپەیەکی هەبێت و ئەنجامینەدات، ئەوە خوای گەورە چاکەیەکی تەواوی بۆ دەنوسێت. ئەگەر مەبەستی بێت خراپەیەك بکات و ئەنجامیشیبدات، ئەوە خوای گەورە تەنها یەك خراپەی لەسەر دەنوسێت.

## فەرموودەی سیی و هەشتەم

### ئەوی خوای گەورە جەنگی لە دژی بەرپاکردووە!

عَنْ أَبِي هُرَيْرَة رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُول اللَّهِ ﷺ إنَّ اللَّهَ تَعَالَى قَالَ: مَنْ عَادَى لِي وَلِيًّا فَقْد آذَنْتهُ بِالْحَرْبِ، وَمَا تَقَرَّبَ إلَيَّ عَبْدِي بِشَيْءٍ أَحَبَّ إلَيَّ مِمَّا افْتَرَضْتُهُ عَلَيْهِ، وَلَا يَزَالُ عَبْدِي يَتَقَرَّبُ إلَيَّ بِالنَّوَافِلِ حَتَّى أُحِبَّهُ، فَإِذَا أَحْبَبْتُهُ كُنْت سَمْعَهُ الَّذِي يَسْمَعُ بِهِ، وَبَصَرَهُ الَّذِي يُبْصِرُ بِهِ، وَيَدَهُ الَّتِي يَبْطِشُ بِهَا، وَرِجْلَهُ الَّتِي يَمْشِي بِهَا، وَلَئِنْ سَأَلَنِي لَأُعْطِيَنَّهُ، وَلَئِنْ اسْتَعَاذَنِي لَأُعِيذَنَّهُ[1].

ئەبوهورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: خوای باڵادەست دەفەرمووێ: هەرکەسێ دژایەتی خۆشەویستێکی من بکات، ئەوا من جەنگی لە دژ بەرپادەکەم. بە ندەم بە هیچ شتێك لە من نزیکنابێتەوە تا خۆشەویست بێت لە لام، وەکو

---

[1] بوخاری (٦٥٠٢)، ئیبنوحیببان (٣٥٢)، بەیهیقی لە: (السنن الکبری/١٩٣٣٣)، بەغەوی لە: (شرح السنة.١٢٣٤).

بەو شتانە لێم نزیکدەبێتەوە کە لەسەریم فەرزکردووە، جا بەندەکەم ئەوەندە بە سوننەتەکانەوە پابەند دەبێت و دەیانکات و لێم نزیکدەبێتەوە پێیان، تا وایلێدێت خۆشمدەوێت، کە خۆشمویست، دەبمە ئەو گوێیەی کە پێی دەبیستێت، دەبمە ئەو بینابیەی کە پێی دەبینێت، دەبمە ئەو دەستەی کە پێی دەوەشێنێت، دەبمە ئەو قاچانەی کە هەنگاویان پێ هەڵدەهێنێتەوە[1]. داوای هەرچییەکم لێبکات پێیدەبەخشم، ئەگەر هانام بۆ بهێنێت پەنایدەدەم و لەخۆمی دەگرم.

---

١ واتە بیستن و دیتن و ئاراستەکردنی دەست و پێی لەژێر سەرپەرشتی خوای گەورەدا دەبێت.

## فەرموودەی سیی و نۆیەم

### لەو کردەوانەت بەرپرسی کە بە ویستی خۆت ئەنجامتداوە

عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إنَّ اللَّهَ تَجَاوَزَ لِي عَنْ أُمَّتِي الْخَطَأَ وَالنِّسْيَانَ وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ [١].

ئیبنوعەباس خوا لێیان رازی بێتدەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: خوای گەورە چاوپۆشی لەو سەرپێچییانەی ئوممەتەکەم کردووە، کە لەڕێی هەڵە و لەبیرچوون و زۆرلێکردنەوە ئەنجامیانداوە.

١ ئیبنوماجە (٢٠٤٥)، بەیهیقی لە: (السنن الکبری ٧/٣٥٠)، طەبەرانی لە: المعجم الوسط (٨٢٧٥)، دارەقوطنی (٤/١٧٠)، ئیبنوحیببان (٧٢١٩). شێخی ئەلبانی رحمەالله لە: (إرواء الغلیل/٨٢)دا دەفەرموێ: (ظاهر إسنادە الصحة).

## فەرموودەی چلەم

له دنیادا ڕێبوارێک بەو بەس

عَنْ ابْن عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: أَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِمَنْكِبِي، وَقَالَ: كُنْ فِي الدُّنْيَا كَأَنَّك غَرِيبٌ أَوْ عَابِرُ سَبِيلٍ. وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولُ: إذَا أَمْسَيْتَ فَلَا تَنْتَظِرْ الصَّبَاحَ، وَإِذَا أَصْبَحْتَ فَلَا تَنْتَظِرْ الْمَسَاءَ، وَخُذْ مِنْ صِحَّتِك لِمَرَضِك، وَمِنْ حَيَاتِك لِمَوْتِك[1].

عبداللّٰهی کوڕی عومەر خوا لێیان ڕازی بێت دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ شانیگرتم و فەرمووی: له دنیادا وەکو غەریبەیەک، یا وەکو ڕێبوارێك بە. ئیبنوعومەر دەیفەرموو: ئەگەر ئێوارەت بەسەرداهات چاوەڕێی بەیانی مەکە، ئەگەر بەیانیت بەسەرداهات چاوەڕێی ئێوارە

---

١ بوخاری (٦٠٥٣)، ترمذی (٢٣٣٣)، ئیبنوماجە (٤١١٤)، ئەحمەد (٢/٤١).

مەکە، کاتەکانی لەشساغییت هەڵگرە بۆ کاتە نەخۆشکەوتنت، ژیانیشت

بکە کێڵگەی دوای مردنت!

# فەرموودەی چل و یەکەم

با حەزەکانت بە پێی ئاڕاستەی پێغەمبەری خوا بێت ﷺ

عَنْ أَبِي مُحَمَّدٍ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يَكُونَ هَوَاهُ تَبَعًا لِمَا جِئْتُ بِهِ[1].

---

١بەیهیقی لە: (المدخل/٢٠٩)، ئیبنوئەبی عاصم لە: (السنة/١٥)، ئیبنوبەططه لە: (الإبانة/٢٩١)، ئیبنولجەوزی لە: (ذم الهوى/ل:٢٢)، بەغەوی لە: (شرح السنة ٢١٢/١). ئیمامی ئیبنوحەجەر لە: (فتح الباري ٢٨٩/١٣)دا هێناویێتیەوەو فەرموویەتی: (رجاله ثقات) ئەمەش مانای بە سەحیحدانانی نییە، جونکە دەشێت پیاوانی سەنەدەکە هەموو جێمتمانەبن بەڵام خودی سەنەدەکە پسانی تێدا بێت، کە ریوایەتەکەی پێ زەعیف دەبێت. والله اعلم. شێخی ئەلبانی رحمەالله لە توێژینەوەی فەرموودەکانی (مشكاة المصابيح. ژمارە ١٦٧)دا دەفەرموێ: زەعیفە. ئیمامی نەوەوی دەربارەی فەرموویەتی : (حديث حسن صحيح رويناه في كتاب الحجة بإسناد صحيح). مەبەستی ئیمامی نەوەوی لە کتێبی الحجة ، کتێبی (كتاب الحجة على تاركي سلوك طريق المحجة)یە کە (الشيخ أبوالفتح نصر بن ابراهيم الشافعى الفقيه الزاهد) نوسیوێتی، کە دەربارەی رێساکانی فەرموودەوانییە. دەفەرموێ لەویدا بەدواداچوونەوەمان بۆی کردووە کە لە

ئەبوموحەممەد کە عبداللەی کوڕی عەمری کوڕی عاصە، خوا لێیان ڕازی بێت دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: باوەڕی هیچ یەکێکتان تەواو نابێت هەتا وەکو ئارەزووەکانی نەکاتە شوێنکەوتەی ئەوەی من هێناومە (کە ئیسلامە).

---

ڕێیەکەوە (حەسەن)و لە ڕێیەکی ترەوە (سەحیح)ە. ئیبنورەجەبی حەنبەلی لە کتێبی (جامع العلوم والحکم)ەکەی خۆیدا ئەمەی ئیمامی نەوەی هێناوەتەوە، بەڵام دەربارەی فەرموویەتی: (تصحیح الحدیث بعید جدا من وجوه) واتە: بە سەحیح دانانی فەرموودەکە لە زۆر لایەنەوە زۆر دوورە بسەلمێت. پاشان خۆی سێ هۆکاری زەعیفکردنی ریوایەتەکەی هێناوەتەوە. وا دەزانم لەم سەردەمەشدا ئەو راجوێیەی لەسەر ماوە، شێخ بن باز رحمەاللە ئیستیشهادی پێکردووەو ئیبنو عوثێمین رحمەاللە بە زەعیفی داناوە.

## فەرموودەی چل و دووەم

ئەگەر تۆ بێی، منیش بە لێخۆشبوونەوە بۆلات دێمەوە

عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: سَمِعْت رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم يَقُولُ: قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: يَا ابْنَ آدَمَ! إنَّكَ مَا دَعَوْتنِي وَرَجَوْتنِي غَفَرْتُ لَك عَلَى مَا كَانَ مِنْك وَلَا أُبَالِي، يَا ابْنَ آدَمَ! لَوْ بَلَغَتْ ذُنُوبُك عَنَانَ السَّمَاءِ ثُمَّ اسْتَغْفَرْتنِي غَفَرْتُ لَك، يَا ابْنَ آدَمَ! إنَّك لَوْ أتَيْتنِي بِقُرَابِ الْأَرْضِ خَطَايَا ثُمَّ لَقِيتنِي لَا تُشْرِكُ بِي شَيْئًا لَأَتَيْتُك بِقُرَابِهَا مَغْفِرَةً [1].

ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ دەیفەرموو: خوای گەورە دەفەرموێ: ئەی نەوەی

[1] ترمذی (٣٤٩١) دەشفەرموێ: (حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ .)، طەبەرانی لە: (الأوسط/ ٤٤٣٧). شێخی ئەلبانی رحمەاللە لە: (صحيح سنن الترمذی/ ٣٥٤٠)و لە: (سلسلة الأحاديث الصحيحة/ ١٢٧) و لە: (الروض النضير/ ٤٣٢)دا دەفەرموێ: سەحیحە.

ئادەم! تۆ هەرچەندم لێ داوا بکەیت و لێم بپاڕێیتەوە لەو گوناحانەی کردووتن زۆر بێباکانە لێت خۆشدەبم و گوێی نادەمێ. ئەی نەوەی ئادەم! ئەگەر تاوانەکانت کەڵەکە ببن و بگەنە ئاستی ئاسمان، پاشان داوای لێخۆشبوونم لێ بکەیت، لێت خۆشدەبم! ئەی نەوەی ئادەم ئەگەر بێیتەوە لام و بەپانتایی زەمین تاوان و سەرپێچیت کردبێت لێتخۆشدەبم منیش بە پانتایی سەرزەمین بە لێخۆشبوونەوە وەرتدەگرمەوە، بەو مەرجەی هاوەڵت بۆ بڕیار نەدابم.